

چەند ڕێگایەک بۆ ئاسان کردنی تەدەبوڕ لە قوڕئانی پیرۆزدا

# كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ



نوسینی : داستان محمد

دیزاین : پێگەی نهاوند



**إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأ شهد أن محمداً عبده ورسوله، أما بعد:**

**گەر تەدەبور کردن لە قورئانی پیرۆزدا بۆ ئەو مەبەستە بێ کە اللە تعالی داوای لێکردووین لە قورئاندا ئەوا کارێکی زۆر چاک و بەرهەمدارە، لەسەرووی هەمووشیان ناسینی اللە تعالی و فێربوونی تەوحید و دوورکەوتنەوە لە شیرک کە ئەمە کرۆکی قورئانە، گەر مرۆڤ تەدەبور کردن لە قورئاندا ماناکانی تەوحیدی لەلا بەهێز کرد و شیرك و سەرچاوەکانی لەلا ناساند و ناشرین کرد ئەوا جوانترین تەدەبوری کردووە لە قورئاندا ئەگەرچی نەخوێندەوار بێت و نەزانێ تەدەبور مانای چیە، بەڵام گەر ئەم مەبەستەی دەست نەکەوت لە قورئان خوێندنەوەدا ئاوا بێ ئاگایە لە کەلامی اللە تعالی ئەگەرچی جوانترین تەدەبور بکات لە بوارەکانی تردا و مانای زۆر وورد و جوان دەربهێنێت لە ئایەتەکاندا، وە تەدەبور کردن بەبێ کارکردن پێی ئەوا هیچ سودێکی نیە و تەنها بارە بەسەر شانی خاوەنەکەیدا، بۆیە هەموو ئامانج لە گوێگرتن و خوێندنەوە و لەبەرکردن و تەفسیر کردن و تەدەبورکردنی قورئان یەک شتە، ئەویش کارکردن بە قورئانە، گەر ئەم ئامانجە نەهاتەدی ئەوا هیچ سودێک لە ئەوانی تردا نیە.**

**داوای لێبووردنیش ئەکەم لە هەڵە ئیملاییەکان و بێ هێزی دارشتن لە نوسیندا چونکە نوسراوەکانی ناو ئەم نامیلکەیە پۆستی فەیسبوکن کە ساڵی پار ژمارەیەک پۆستم کرد دەربارەی تەدەبور ئێستا کۆم کردۆتەوە لەم نامیلکەیەدا، مەعلومیشە شێوازی دارشتنی کتێب و نامیلکە جیاوازە لەگەڵ شێوازی پۆستدا، بەڵام گرنگ سوودمەند بوونە.**

**داستان محمد**

**24 / صفر / 1441**

**2019 / 10 / 23**

**تەبلیسی - جۆرجیا**

# تەدەبور (التَّدَبُّر) چیە ؟؟؟

**پێش ئەوەی باسی تەدەبور لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بکەین ئەبێ بزانین تەدەبور چیە ؟**
**التدبر لەڕووی زمانەوانی و شەرعەوە هەرهەمان مانای هەیە، بەپێچەوانەی زۆربەی زاراوەکانی ترکە لەڕووی زمانەوانی و شەرعەوە مانایان جیایە.**

## تەدەبور لەڕووی زمانەوانیەوە (لغة) :

**الزجاج ئەڵێ: تەدەبور بریتیە لە ڕوانین لە کۆتایی شتێک.**

**ابن فارس ئەڵێ: (دبر) ئەصلی ئەم ووشەیە زۆرینەی لەیەک قیاس دایە ئەویش بریتیە لە کۆتایی شتێک.**

**الجرجاني ئەڵێ: عیبارەتە لە ڕوانین بۆ کۆتایی شتەکان، شتێکی نزیکە لەبیرکردنەوە (التفکر) بەڵام بیرکردنەوە تەصەروفی دڵە بە ڕوانین لە بەڵگە، وە تەدەبور تەصەروفی دڵە بە ڕوانین لە کۆتایی.**

## تەدەبور لەڕووی شەرعەوە (إصطلاحا) :

**ابن عطیة ئەڵێ: تەدەبور بریتیە لە ڕوانین بۆکۆتایی کارەکان و تەئویلکردنی شتەکان.**

**البغوي ئەڵێ: بریتیە لە ڕوانین بۆکۆتایی کارەکە، وە (دُبُر)ی هەموو شتێک کۆتاییەکەیەتی.**

**الزمخشري ئەڵێ: (تدبر الأمر) واتا: لێووردبوونەوەیی و ڕوانین لەکۆتاییەکەی و بەرەو کوێ ئەڕوات سەرەنجامی و کۆتاییەکەی، پاشان ووشەی (تدبر) لە هەموو لێووردبوونەوەیەک بەکارهاتووە، جا مانای (تدبر القرآن) واتا: لێووردبوونەوەی ماناکانی ورۆشن بینی ئەوشتانەی تیایدایە.**

**الرازي ئەڵێ: (التدبیر والتدبر) بریتین لە ڕوانین لە کۆتایی کارەکان.**

**الشوکاني ئەڵێ: (تدبرت الشيء) واتا: بیرم لە کۆتاییەکەی کردەوە و لێی ووردبوومەوە، جا ئەم ووشەیە بەکارهاتووە بۆ هەموو ووردبوونەوەیەک، وە (التدبیر) واتا: مرۆڤ کاروباری خۆی ڕاپەڕێنێ وەکو ئەوەی بڕوانێتە سەرەنجامی کارەکەی بەچی ئەگات.**

**جا لێرەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە هەم لەلای زانایانی زمان وە هەم لای زانایانی تەفسیر ووشەی (تدبر) بەیەک مانا دێت، ئەویش ڕوانین و تێڕامان و ووردبوونەوەیە لە ئایەتەکان تاکو بزانین سەرئەنجام و کۆتایی ئایەتەکە مەبەست تیایدا چیە.**

## جیاوازی نێوان (تەدەبور) و (تەفسیر) چیە ؟؟؟

تدبر فراوانترە لە تەفسیر بەوپێیەی الله تعالى داوای لە هەموو مرۆڤێک کردووە کە تەدەبوری قورئان بکات بە زانا و عەوام و کافر و مونافیقەوە (أفلا يتدبرون القرآن) (ليدبروا آياته)، بەڵام تەفسیر هەموو کەسێک ناتوانێ بیکات، تەنها زانایانێک نەبن کە مەلەکەی تەفسیریان هەیە، چونکە تەفسیرکردنی قورئان پێویستی بە چەند ئامرازێک هەیە کە ئەبێ لەو کەسەدا بوونی هەبێ کە تەفسیری قورئان ئەکات، وەکو: شارەزاییەکەی باش لە زمانی عەرەبی و نحوو صرف و ناسخ و منسوخ و عام و خاص و مطلق و مقید و ئاگادار بوون و شارەزاییەکی باش بە تەفسیری سەلەف، هەروەها بەلاغە و چەند علمێکی ترکە زۆر تا کەم بە سوودە بۆ کەسی موفەسیر. هەروەک ابن حزم ئەڵێ: گەر تەدەبور لەتوانای مرۆڤدا نەبوایە ئەوا الله تعالى داوای لێنەدەکردن چونکە (لا يكلف الله نفسا إلا وسعها) بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نیە هەر کەسێکی عەوام ویستی تەدەبور لە قورئان بکات هەر ئایەتێکی خوێندەوە بەبێ گەڕانەوە بۆ تەفسیر یان ووتەی هیچ زانایەک لەسەری بەتێگەیشتنی خۆی تەدەبوری تیا بکات و بڵاوی بکاتەوە و بڵێ ئەم ئایەتە ئەمە ئەگەیەنێ، لەکاتێکدا تەدەبورەکەی ئەو پێچەوانەی تەفسیری هەموو زانایان بێ یان هیچ پەیوەندی بەمانای ئایەتەکەوە نەبێ، بێگومان ئەبێ سەرەتا بگەڕێیتەوە سەر تەفسیرێکی ئاسان مانای ئایەتەکە بەکورتی بزانی ئینجا لەچوارچێوەی ئەم مانایەدا تەدەبور بکەی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک ئایەت هەیە لە قورئاندا کەسێک تەنها عەرەبی بزانێ ئەتوانێ تەدەبوری تیادا بکات بەبێ گەڕانەوە بۆ هیچ کتێبێکی تەفسیر و ووتەی هیچ زانایەک، هەروەک ابن عباس رضي الله عنه ئەڵێ: تەفسیر چوار جۆرە: جۆرێکیان کەس عوزری نیە بڵێ نایزانم، جۆرێکیان عەرەب ئەیزانێ بەهۆی زمانەکەیەوە، جۆرێکیان زانایان ئەیزانن، جۆرێکیان کەس نایزانێ جگە لە الله تعالى) جا جۆری یەکەمیان هیچ کەس عوزری نیە بە نەزانینی، وەکو ئەگێڕنەوە دوو پیاو بووە دەمەقاڵێیان لەسەر ئەوەی کە خەڵکانێک سوجدە بۆ گۆڕ ئەبەن، یەکێکیان ووتی: ئەمە کوفرە الله تعالى فەرموویەتی (وأن المساجد لله فلا تدعوا مع الله أحدا) [الجن: 18]، ئەوی تریان ووتی: کەسانی وەکو من و تۆ بۆمان نیە تەفسیری قورئان بکەین، پیاوەکە بێدەنگ بوو تاکو کچی پیاوەکەی تر دەرکەوت، ووتی ئەم کچە کێیە ؟ ووتی: کچی خۆمە، ئەویش ووتی: بۆ نایخوازی ؟ پیاوەکە پێکەنی ووتی کچی خۆم بخوازم ؟ ئەویش ووتی: بۆ کێشەی چیە ؟ پیاوەکە ووتی: ئایا نەتبیستووە الله تعالى فەرموویەتی: (حرمت عليكم أمهاتكم وبناتكم) واتا: دایکانتان وکچانتان حەڕامن بۆتان، پیاوەکەش ووتی: تۆ ئەڵێی کەسانی وەکو من و تۆ نابێ قورئان تەفسیر بکەن !!!

جا هەندێک ئایەت هەیە تەنها بە تێگەیشتن لە ماناکەی ئەتوانی لێی تێبگەیی و تەدەبوری تیادا بکەی، وە بابەتی تەدەبور زۆر فراوانترە لە تەفسیر من ئەتوانم بەجۆرێک تەدەبور بکەم تۆش بەجۆرێکی تر و کەسێکی تریش بەجۆرێکی تر لەکاتێکدا هەر سێکمان بەیەک مانا تێگەیشتووین لە ئایەتەکە و هاوڕاین لە تەفسیر کردنی.

لەکۆتاییدا تەدەبور شتێکی قوڕس و ئاڵۆز نیە کە کەسی عەوام بیری لێنەکاتەوە گەر وابوایە الله تعالی داوای لێنەئەکردین تەدەبور بکەین، وە بەم جۆرەش نیە بەبێ زانینی هیچ تەفسیرێک و نەزانینی عەرەبی دانیشیت ئایەت بە ئایەت تەدەبور بکەی بەجۆرێک کە هەرگیز یەکنا‌گرێتەوە لەگەڵ مانای ئایەتەکەدا.

## پەیوەندی نێوان تەدەبور و تەفسیر بە ڕەئی:

ئایا تەدەبور واتا تەفسیر کردنی قوڕئان بە ڕەئی خۆمان ؟؟؟

لە زنجیرەی پێشوو جیاوازی نێوان (التدبر و التفسیر)مان باسکرد، وە ووتمان الله تعالی داوای لە هەموو مرۆڤێک کردووە بە کافر و موسڵمانەوە بە عەوام و زاناوە کە تەدەبور بکات لە قوڕئانی پیرۆزدا هەروەک فەرموویەتی: (أفلا يتدبرون القرآن) [محمد: 24]، بەڵام باسی ئەوەشمان کرد کە تەدەبور مانای ئەوە نیە هەر کەسێک هەڵسێ بەبێ زانینی عەرەبی یان بەبێ زانینی تەفسیر و مانای ئایەتەکە لەخۆیەوە قسە بکات دەربارەی قوڕئاندا لەژێر ناونیشانی تەدەبور لەکاتێکدا قسەکانی ئەو هیچ پەیوەندییان بە ئایەتەکەوە نیە ئەمەش بەهۆی لاوازییەکی زۆر لە زمانی عەرەبی یان نەگەڕانەوە بۆ هیچ تەفسیرێک تاکو لە مانای گشتی ئایەتەکە بگات، لە هەمان کاتیشدا ووتمان تەدەبور شتێکی ئاوا ئاڵۆز و زەحمەتیش نیە کە جگە لە زانای ڕۆچوو (الراسخ) کەس بۆی نەبێ باسی بکات، گەر وابوایە ئەوا الله تعالی داوای لە هەموو کەسێک نەئەکرد کە تەدەبور بکات لە قوڕئان، کەواتە ئەوەی مانای گشتی ئایەتەکانی زانی چ بەهۆی زانینی زمانی عەرەبی بێ یان بەهۆی گەڕانەوە بۆ تەفسیرێکی ئاسان، بۆی هەیە بە ڕەئی خۆی تەدەبور بکات لە قوڕئاندا ؟؟؟

ئەبێ موسڵمانان ئەوە بزانن کە قسە کردن بەناوی الله و دەربارەی الله و کەلامی الله بەبێ عیلم، شتێکی زۆر گەورە و ترسناکە و هەڕەشەی لەسەرە، هەروەک الله تعالی فەرموویەتی: (قل إنما حرم ربي الفواحش ما ظهر منها وما بطن والإثم والبغي بغير الحق وأن تشركوا بالله ما لم ينزل به سلطانا وأن تقولوا على الله ما لا تعلمون) [الأعراف: 33]، لێرەدا الله تعالی باسی حەڕام بوونی چەند شتێکی کردووە کە داوێن پیسی و تاوان و زوڵم و شیرك و قسەکردنە دەربارەی الله تعالی بەبێ عیلم، سەیرکەن قسەکردنی بێ عیلم دەربارەی الله تعالی

لەگەڵ شیرك و زوڵم و تاوان و داوێن پیسی هێناوە، هەروەها سەرزەنشتی أهل الكتاب-ی کردووە کە ووتەکانیان گۆڕیوە و ماناکانیان تەحریف کردووە و لەمانای ڕاستی لایانداوە، قال تعالى: (وإن منهم لفريقا يلوون ألسنتهم بالكتاب لتحسبوه من الكتاب وما هو من الكتاب ويقولون هو من عند الله وما هو من عند الله ويقولون على الله الكذب وهم يعلمون) [آل عمران: 78]، واتا: کەسانێکیان تیادایە لە یەهود زمانیان لار ئەکەنەوە لەکاتی خوێندنەوەی تەوڕات (بۆگۆڕینی لەفزەکەی و ماناکەی) تاوەکو وای بۆ خەڵکی نیشان بدەن کە ئەمە کتێبی الله دایە کەچی ئەمە لەکتێبی الله دا نیە، وە ئەڵێن ئەمە لەلای الله هاتووە کەچی لەلای الله نەهاتووە، وە دەربارەی الله تعالى شتانێکی درۆ ئەڵێن کە ئەشزانن درۆیە.

جا هەرکاتێک قسەکردن لەسەر ئایەتێکی قورئان بە ڕەئی پێچەوانەی تەفسیری (المأثور) بوو ئەوا ڕەت ئەکرێتەوە، تەفسیری (المأثور)یش ئەوەیە کە بەڕیوایەت گێردراوەتەوە لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم یان هاوەڵانی رضي الله عنهم یان زانایانی تابعینی موفەسیر رحمهم الله، بۆیە ئەبێ ئاگاداری ئەم خاڵە بن بە ووردی تەدەبورکردنی قورئان هۆکارێکە بۆ جوانتر تێگەیشتن لە قورئان نەک بریتی بێ لە کردنەوەی دەرگا بۆ زندیقەکانی سەردەم کە بەشێوەیەک دەربارەی ئایەتەکان قسە ئەکەن نە شەرع ڕێگای پێداوە نە زمانی عەرەبیش قبوڵی ئەم مانایانە ئەکات، هەروەک سەلەف ووتوویانە: هەر کەسێک دەربارەی قورئان قسە بکات بەڕەئی ئەوا هەڵەی کردووە ئەگەرچی بشپێکێ.

جا بۆیە موسڵمانێکی عەوام کاتێک ئەیەوێ تەدەبور لە ئایەتەکانی قورئاندا بکات بەڵام هیچ تەفسیرێکی زانایانی متمانە پێکراوی نەخوێندۆتەوە یان عەرەبیەکەی بەشی ئەوە ناکات مانای گشتی ئایەتێکی پێ بزانێ لەگەڵ ئەمەشدا بەجۆرێک تەدەبور لە ئایەتەکاندا ئەکات، لەم کاتەدا بۆی نیە ئەم شتە بڵاوبکاتەوە لەنێو خەڵکیدا یان پۆستی بکات لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا تاوەکو دڵنیا ئەبێتەوە تەدەبورەکەی دژی مانای گشتی ئایەتەکە نیە و پێچەوانەی تەفسیری زانا متمانە پێکراوەکان نیە، چونکە لە کۆتاییدا تەدەبوریش قسەکردنە دەربارەی کەلامی الله تعالى بەڵام بەشێوەیەکی فراوانتر لە تەفسیر.

## مەرجەکانی (تەدەبور) چین ؟؟؟

ئەگەرچی تەدەبور کردنی قورئانی پیرۆز شتێکی گرنگ و پێویستە، بەڵام پێویستە لەسەر کەسی تەدەبورکەر (متدبر) ڕەچاوی چەند شتێک بکات لەکاتی تەدەبورکردنی قورئاندا بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە تەدەبورەکانیان بڵاو ئەکەنەوە بۆ خەڵکی.

1- دووركەوتنە لەو مانايانەی کە پێچەوانەی عەقیدەی صەحیحە، وەک ئەوەی ئەهلی بیدعە و مەدرەسە عەقڵانیەکان ئەنجامی ئەدەن بەناوی تەدەبورکردن لە قورئان، لەکاتێکدا هیچ نیە جگە لە دژایەتی قورئان و گۆڕینی ماناکانی.

2- ئەو تەدەبورەی ئەیکەی ئەبێ موافقی زمانی عەرەبی صەحیح بێ چونکە قورئان بە زمانی عەرەبی دابەزیوە، ناکرێ مانای ئایەتێک یان ووشەیەک بەجۆرێک لێک بدرێتەوە کە عەرەبی ڕەسەن ئەم شتەی هەرگیز نەبیستووە و لەزمانی ئەودا بوونی نیە.

3- دووركەوتنە لەشتی نامۆ و ڕۆچوونی قوڵ لە دەرهێنانی مانا لە ئایەتەکاندا، چونکە تەدەبور بۆ ڕوونکردنەوە و نزیککردنەوەی ماناکانی قورئانە نەک باسکردنی شتی نامۆ و شاز.

4- دووركەوتنەوە لە تەفسیرە باطنیەکان ئەوانەی کە ئەڵێن ئایەتەکان مانایەکی تری شاراوەیان هەیە بەپێچەوانەی مانا ڕووکەشەکەی، وەکو ئەوەی ڕافیزە باطنیەکان ئەنجامی ئەدەن لە تەفسیری قورئان .

5- تەدەبورکردن واتای خوارکردنەوەی دەقە قورئانیەکان و زۆر لەخۆکردن نیە بۆ بەڵگە هێنانەوە بە ئایەتەکان، بۆنموونە: کەسێک بابەتێکی هەیە ئەیەوێ باسی بکات و دەوڵەمەندی بکات بە دەقە قورئانیەکان، بەزۆر ئایەتێک ئەهێنێت و لەگەڵ بیرۆکەکەی ئەیگونجێنێ گوایە گەر تەدەبور لەم ئایەتەدا بکەین ئەوا هەمان ئەو مانایە ئەدات کە خاوەنی بابەتەکە مەبەستیەتی، ناکرێ بەزۆر ئایەتەکان بگونجێنین لەگەڵ فکرە و هەوا و ئارەزووەکانمان، قورئان کەلامی الله یە ئەبێ بەگوێرەی مەبەستی الله تعالی لە ئایەتەکانی بڕوانین نەک گونجاندنی لەگەڵ فکرەکانی خۆمان.

6- ئەو شتەی کەسی تەدەبور کەر پێی ئەگات لەکاتی تەدەبورکردن لە ئایەتەکان، نابێ پێچەوانەی تەفسیری زانایانی موعتەبەری ئوممەت بن، کە کەس تا ئێستا ڕەخنەی نەبووە لە تەفسیرەکەیان بۆ ئەم ئایەتە، کەچی تۆ هاتووی بەجۆرێک تەدەبوری ئایەتەکەت کردووە دژی تەفسیری هەموویانە یان زۆرینەیان.

7- ئەو کەسەی توانای جێبەجێ کردنی ئەم خاڵانەی نیە لەکاتی تەدەبوری قورئانی پیرۆزدا، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بەپێی توانای تەدەبوری تیادا ئەکات، ئەو مانایانەی کە ئەو پێیگەیشتووە ئەتوانێ لە کەسێکی بپرسێ کە شارەزای بێت لە بوارەکەدا تا مانا ڕاست و هەڵەکانی بۆ دەست نیشان بکات.

## پێوەرە قورئانییەکان بۆ تەدەبور کردن:

چەند پێوەرێک هەیە لە قورئانی پیرۆزدا دەری ئەخات کە خوێنەری قورئان تا چەند پەیوەندی لەگەڵ قورئاندا هەیە و تا چەند قورئانی پیرۆزکاریگەری بەسەریەوە هەیە و تا چەند تەدەبور لە ماناکانی قورئانی

پیرۆز ئەکات، هەروەک الله تعالی ئەفەرمووێ: (إنما المؤمنون الذين إذا ذكر الله وجلت قلوبهم وإذا تليت عليهم آياته زادتهم إيمانا وعلى ربهم يتوكلون) [الأنفال : 2]، واتا: (بەڕاستی ئیماندارانی ڕاستەقینە ئەوانەن کە هەرکاتێک یادی الله تعالی کرا دڵیان ئەترسێ، وە کاتێک ئایەتەکانی الله تعالی بەسەریاندا ئەخوێندرێتەوە ئیمانیان زیاد ئەکات و تەنها پشت بە پەروەردگاریان ئەبەستن).

جا کاتێک بە بیستنی قورئانی پیرۆز هەستت بە زیادبوونی ئیمان کرد ئەوا نیشانەی هەبوونی کاریگەری قورئانە بەسەرتەوە، هەروەها تەدەبور کردنە لە ئایەتەکانی قورئان، وە هەرکاتێک لەکاتی بیستنی قورئان هیچ گۆڕانێک بەسەردڵتدا نەهات و هەستت بەزیادبوونی ئیمان نەکرد ئەوا ئەمە نیشانەی دووری نێوان تۆ و قورئانی پیرۆزە و پێویستیت بە تەدەبورکردنە لە مانای ئایەتەکان تا ئەو گۆڕانکارییە تیاتدا ڕووبدات.

چەند ئایەتێک هەیە کە ئاماژەن بۆ ئەوەی کەسی خوێنەری قورئان تەدەبور ئەکات لە ئایەتەکان و بەم شێوەیە قورئان ئەخوێنێتەوە کە داوای لێکراوە:

1- بەهۆش بوونی دڵ و بیرت لەکاتی خوێندنی قورئان، بەڵام بیرڕۆیشتن بۆ دونیا و کاروبارەکانی و تەنها بە زمان بیخوێنیتەوە ئەمەیان لەصیفاتی کەسانی تەدەبورکەر نیە، الله تعالی دەربارەی صیفاتەکانی عباد الرحمن ئەفەرمووێ: (والذين إذا ذكروا بآيات ربهم لم يخروا عليها صما وعميانا) [الفرقان : 73]، واتا: (ئەوانەن کە کاتێک بەڵگە بیستراو و بینراوەکانی الله تعالی-یان بیر ئەخرێتەوە گوێچکەیان کەڕناکەن و چاویان کوێرناکەن لە ئاستی ئەم بەڵگانە).

2- گریان لەترسی الله تعالی وزیادبوونی خشوع، الله تعالی ئەفەرمووێ: (قل آمنوا به أولا تؤمنوا إن الذين أوتوا العلم من قبله إذا يتلى عليهم يخرون للأذقان سجدا - ويقولون سبحان ربنا إن كان وعد ربنا لمفعولا - ويخرون للأذقان يبكون ويزيدهم خشوعا) [الإسراء : 107-109]، واتا: (ئەی پێغەمبەر"صلى الله عليه وسلم" پێیان بڵێ: ئیمان بهێنن هیچ سود بە الله ناگەیەنێ، وە ئیمانیش نەهێنن هیچ زیان بە الله ناگەیەنێ، ئەوانەی کە کتێبە ئاسمانیەکانی پێشوویان خویندۆتەوە کاتێک قورئانیان بەسەردا ئەخوێندرێتەوە سوجدەی شکور ئەبەن بۆ الله تعالی - وە لەکاتی سوجدە بردنیاندا ئەڵێن پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگارمان کە بەڵێنی بەجێ نەگەیەنێ ئەو بەڵێنەی دابووی بە ناردنی محمد صلى الله عليه وسلم هێنایە دی وە بەڵێنی الله تعالی بۆ هەموو شتێک هەردێتە دی بێگومان - وە سوجدە ئەبەن بۆ الله تعالی ئەگرین لەترسی ئەو وەگوێگرتنیان لە قورئان و تەدەبورکردنی ماناکانی وایان لێئەکات خشوعیان زیاد بێ بۆ الله تعالی.

3- mووچڵک هاتن بە لەشدا و ملکەچ بوون، الله تعالى ئەفەرمووێ: (الله نزل أحسن الحديث كتابا متشابها مثاني تقشعر منه جلود الذين يخشون ربهم ثم تلين جلودهم وقلوبهم إلى ذكر الله ذلك هدى الله يهدي به من يشاء ومن يضلل الله فما له من هاد) [الزمر: 23]، واتا: (الله تعالى باشترين ووتەی دابەزاندووە کتێبێکە ئایەتەکانی لەیەکتر ئەچن، بەخوێندنەوەی ئایەتەکانی هەڕەشە و سزا مووچڵک بە پێستی ئەوانە دادێت کە لە پەروەردگاریان ئەترسن، وە پاشان پێست و دڵیان نەرم ئەبێتەوە بۆیادی الله تعالى کاتێک ئایەتەکانی موژدە و پاداشت ئەبیستن، ئەمەش هیدایەتی الله یە بیەوێ بیدات بەهەرکەسێک پێی ئەدات، وە هەرکەسێک الله گومڕای بکات و سەرکەوتووی نەکات بۆ هیدایەت کەس نیە بتوانێ هیدایەتی بدات).

4- زیادبوونی ئیمان و دڵخۆشبوون، الله تعالى ئەفەرمووێ: (وإذا ما أنزلت سورة فمنهم من يقول أيكم زادته هذه إيمانا فأما الذين آمنوا فزادتهم إيمانا وهم يستبشرون) [التوبة : 124]، واتا: (کاتێک سورەتێک دائەبەزێ هەندێک لە مونافیقان بە گاڵتەوە ئەڵێن: کام لەئێوە ئیمانی زیادی کرد بە دابەزینی ئەم سورەتە ؟ بەڵام ئەوانەی ئیمانداری ڕاستەقینەن ئیمانیان زیادی کرد بە دابەزینی سورەتەکە و دڵیان خۆشبوو.

5- سەرسام بوون بەوپاراوی وڕەوانبێژی وحیکمەتەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هەیە، الله تعالى ئەفەرمووێ: (قل أوحي إلي أنه استمع نفر من الجن فقالوا إنا سمعنا قرءانا عجبا) [الجن : 1]، واتا: (ئەی پێغەمبەر"صلى الله عليه وسلم" بڵێ کە وەحیم بۆ هات لەلای الله تعالى کە ژمارەیەک لە جنۆکە گوێبیستی قورئان خوێندنی من بوون، جا کاتێک گەڕانەوە بۆلای قەومەکەیان ووتیان: بەڕاستی ووتەیەکی سەیرمان بیست بەهۆی ئەو پاراوی وڕەوانبێژییەی تیایدایە.

6- وەرگرتنی پەند لە ئایەتەکانی قورئان وبەراوردکردنی لەگەڵ حاڵی خۆت، تۆلەکوێی ئەم ئایەتانە دایت؟ بەستنەوەی ئایەتەکانی قورئان بە واقعی ژیانت نیشانەی تەدەبور کردنە، الله تعالى ئەفەرمووێ: (فلما حضروه قالوا أنصتوا فلما قضي ولوا إلى قومهم منذرين) [الأحقاف : 29]، واتا: (کاتێک جنۆکەکان ئامادەبوون بۆ بیستنی قورئان لە پێغەمبەر"صلى الله عليه وسلم" بەیەکتریان ووت: بێدەنگن بن تا بتوانین قورئانەکە ببیستین، جا کاتێک خوێندنەوەی پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" تەواو بوو، جنۆکەکان گەڕانەوە بۆلای قەومەکانیان وئاگاداریان کردنەوە وهەڕەشەیان لێکردن گەرباوەڕبە قورئان نەهێنن).

7- کارکردن بە قورئان گەورەترین نیشانەیە لەسەر تەدەبورکردنی خوێنەری قورئان، چونکە ئامانج لە تەدەبورکردن کارکردنە بە ئایەتەکان، الله تعالى ئەفەرمووێ: (كتاب أنزلناه إليك مبارك ليدبروا آياته وليتذكر أولوا الألباب) [ص : 29]، واتا: (ئەم قورئانە کتێبێکە بۆ تۆمان دابەزاندووە موبارەکە و پڕیەتی لەخێر و

بەرەکەت بۆ ئەوەی مرۆڤەکان تەدەبور بکەن لە ئایەتەکانیدا و تێبفکرن لە ماناکانیدا، وە تاکو خاوەنانی بیرو هۆش پەند و ئامۆژگاری لێوەربگرن.

## هۆکارە یارمەتیدەرەکان بۆ تەدەبور کردن:

چەندین هۆکاری یارمەتیدەر هەیە بۆ تەدەبورکردنی موسڵمان لەکاتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، کە پێویستە موسڵمانان هەوڵی بۆ بدەن بەڵکو هەندێکیان حەتمیە هەر ئەبێ ئەنجام بدرێ هەندێکی تریشی یارمەتیدەری ئیزافیە.

### 1- بەدیهێنانی تەوحید و ئیخلاص:

بەدوورکەوتنەوە لە شیرکی ئاشکرا و شاراوە، چونکە لەگەڵ هەبوونی شیرکدا چ گەورە بێ کە لەدین ئەتباتە دەرەوە چ بچووک بێ وەکو ڕیا هیچ کردەوەیەک سوودی نیە بۆ خاوەنەکەی ئەگەرچی خوێندنەوەی قورئان و تەدەبورکردن و کارکردن بێ بە قورئان، الله تعالى ئەفەرمووێ: (وقدمنا إلى ما عملوا من عمل فجعلناه هباء منثورا) [الفرقان : 23]، واتا: (چووین بەرەو ئەوکردەوە چاکانەی کە کافران ئەنجامیاندابوو لە دونیادا، جا هیچ سوودی پێنەگەیاندن و کردەوەکانی ئەوانمان بەتاڵ کردەوە وەکو تۆزی پەرش بوو) کاتێک تیشکی خۆر لە پەنجەرە یەتە ژوورەوە سەیری تیشکەکەی ئەکەی ئەبینی شتانێکی ووردی تیایدایە وەکو تۆز وایە.

وە یەکێک لەجۆرەکانی شیرك ئەوەیە کە مەبەستت تیایدا بەدیهێنانی بەرژەوەندی دونیایی بێ چ مەعنەوی وەکو مەدحکردن و ناودەرکەوتن لەلای خەڵکی، یان ماددی کە مەبەستت وەرگرتنی پۆست و پارە و پلە بێ، جا بۆیە پێویستە خۆمان بەدووربگرین لە هەموو شیرکێکی گەورە و بچووک، ئاشکرا و شاراوە، تا کردەوەکانمان سوودی هەبێ بۆمان، وە لەناو خودی کردەوەکەش خۆمان لە شیرکی بچووک بپارێزین کە ڕیایە ئەبێتە هۆی بەتاڵ کردنەوەی کارەکەمان وگوناهباربوونمان لەسەری، والله المستعان.

بزانە ڕەحمەتت لێبێ کە ئیخلاص کلیلی کردنەوەی عیلم و تێگەیشتنە، الله تعالى ئەفەرمووێ: (واتقوا الله ويعلمكم الله) [البقرة : 282]، واتا: (تەقوای الله بکەن بە بەجێهێنانی فرمانەکانی و خۆپاراستن لە نەهیەکانی، وە الله تعالى ئەم شتانەتان فێرئەکات کە سوودی دین و دونیای هەیە بۆتان)، جا نیەتت لەخوێندنەوەی قورئان و لەبەرکردنی و تەدەبورکردنی و کارپێکردنی تەنها نزیکبوونەوە بێ لە الله تعالى، هەمیشە ئەوەت لەبیربێ ئەو شتەی کەتۆ ئەیخوێنیتەوە کەلامی الله تعالى یە، خۆت بپارێزە لە شوهرەت و خۆدەرخستن و حەزکردن بە مەدح و بەدەست هێنانی ماڵی دونیا بەهۆی قورئانی پیرۆزەوە، ئەوە بزانە کەهیچ کردەوەیەک

قبوڵ نیە ئیللا بەم دوو مەرجە: ئیخلاص و صەواب، ئەبێ بە خالصی بۆ الله تعالی ئەنجامی بدەیت، وە موافقی شەرعیش بێ نابێ لەخۆتەوە شتانێک دابهێنیت کە لە شەرعدا نیە. الله تعالی لە فەرموودەیەکی قودسی ئەفەرمووێ: (من عمل عملا أشرك فيه غيري تركته وشركه) [صحيح مسلم : 2985]، واتا: (هەرکەسێک کردەوەیەک ئەنجام بدات کەسێکی تر بکات بە شەریکم لە نیەتەکەیدا، ئەوا کردەوەکەیی و شەریکەکەی بەجێ ئەهێڵم) واتا کردەوەکە بەتاڵە لەلای الله تعالی و قبوڵی ناکات، بەڵکو بەجێی ئەهێڵی بۆ شەریکەکەی با ئەو پاداشتی کردەوەی بداتەوە.

جا هەرکاتێک موسڵمان تەوحیدی بەدیهێنا لەخۆیدا و ئیمانی زیادی کرد، الله تعالی دەرگای تەدەبور و تێگەیشتن لەمانای ئایەتەکانی بەسەردا ئەکاتەوە.

## 2- دوورکەوتنەوە لە گوناه و تاوان:

ئەو دڵەی تاریکبووە بە گوناه و تاوان، وە سەرقاڵە بە خۆشیەکانی دونیاوە، ئەوا تەنگ ئەبێ بە نوری قورئان بەهۆی پێشخستنی دونیا بەسەر قیامەتدا، گوناهکردنیش ڕێگرە لە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و موراجەعەکردنەوە و تەدەبورکردن لە ئایەتەکانیدا، وەهەروەها وەسواسیەکانی شەیطان دڵ دوورئەخاتەوە لە زیکری الله، الله تعالی ئەفەرمووێ: (استحوذ عليهم الشيطان فأنساهم ذكر الله) [المجادلة: 19]، واتا: (شەیطان کۆنترۆڵی بەسەردا کردن جا زیکری الله ی لەبیر بردنەوە).

الضحاك بن مزاحم ئەڵێ: هیچ کەسێک نیە کە قورئان لەبەربکات دواتر بیری بچێتەوە ئەوا ئیللا بەهۆی گوناهێکەوە بووە کە ئەنجامیداوە، چونکە الله تعالی ئەفەرمووێ: (وما أصابكم من مصيبة فبما كسبت أيديكم) [الشورى: 30]، واتا: (توشی هەر خراپە و ناخۆشیەک بن ئەوا بەهۆی کاروکردوەی خۆتانە)، وە لەبیرچوونەوەی قورئانیش یەکێکە لە گەورەترین موصیبەتەکان.

جا گوناهکردن و تاوان وائەکات کە دڵ نەخۆش و لاواز بێ، وە ڕێگری ئەکات لە گەیشتنی نورِ و ئیمان بۆ دڵ، عبدالله بن المبارك ئەڵێ:

رأيت الذنوب تميت القلوب
وقد يورث الذل إدمانهـــــا
وترك الذنوب حياة القلـوب
وخير لنفسك عصيانهـــــا

بینیم گوناھ دڵ ئەمرێنێ

وە ئاڵودەبوونی گوناھ توشی زەلیلیت ئەکا

وە وازهێنان لە گوناھ ژیانەوەی دڵەکانە

وە باشترین شت بۆ نەفس سەرپێچیکردنی نەفسە

3- هەڵبژاردنی کات و شوێنی گونجاو بۆ تەدەبور کردن:

یەکێک لەو شتانەی یارمەتیدەرە بۆ ئامادەکردنی دڵ و صاف کردنی مێشك و تەدەبورکردن هەڵبژاردنی کات و شوێنی گونجاوە.

بێنە بەرچاوت بە جەماعەت نوێژی بەیانی بکەیت لەدوای موسڵمانێک و لەناو موسڵماناندا کاتێک ئەبیستی ئیمام ئەم ئایەتە ئەخوێنێ: (وقرءان الفجر إن قرءان الفجر كان مشهودا) [الإسراء: 78]، واتا: (وە نوێژی بەیانیش بکە و قورئانی زۆر تیادا بخوێنە، بەڕاستی فریشتەکانی شەو و ڕۆژ ئامادەی نوێژی بەیانی ئەبن)، تۆش ئەزانی الله تعالى مەبەستی نوێژی بەیانیە، کە گوێبیستی ئەم ئایەتە ئەبیت لەم کات و شوێنەدا ئەبێ هەست بەچ خۆشیەک بکەیت لەکاتێکدا ئەزانی زۆربەی ئوممەت لەم کاتەدا خەوتووە (إلا ما رحم ربي)، جا ئایا ئەم کات و شوێنە وەکو ئەوەیە کە کاتێک دەستت بەتاڵە و نازانی چی بکەیت ئەڵێی با تۆزێک قورئان بخوێنم یان گوێی لێبگرم، یان لەشوێنێکدایت کەسانێک بە مۆبایل و گۆرانی و تەلەفزیۆنەوە خەریکن تۆش لەناویاندا دانیشتووی ئەتەوێ قورئان بخوێنێ، بێگومان زۆر زەحمەتە لەم کاتەدا ماناکان بگەن بە دڵت و شەکانی قورئان قورگت تێپەڕێنن، ئایا ئەم کات و شوێنە وەکو ژوورێکی تاریک وایە لەسێیەکی کۆتایی شەودا بە نەرمی قورئان ئەخوێنێ لە شەونوێژدا ئەگەیت بە ئایەتی: (تتجافى جنوبهم عن المضاجع يدعون ربهم خوفا وطمعا) [السجدة: 16]، واتا: (دوورئەکەونەوە لەسەر جێگای خەوتنیان، لەنوێژەکانیاندا و لە دەرەوەی نوێژیش لە پەروەردگاریان ئەپاڕێنەوە لەترسی سزاکانی هەروەها داوای لێئەکەن بەهۆی هەبوونی هیوا بە نیعمەتەکانی) واهەست ئەکەی ئایەتێک ئەخوێنیتەوە ئێستا تۆی تیادایە و وەصفی تۆ ئەکات، لە الله تعالى داواکارم ئەم کات و شوێنە گونجاوانەمان پێ ببەخشێ تاکو تەدەبور بکەین لە ووتەکانی و لەمانای ئایاتەکانی بگەین بە دڵێکی زیندوو.

## 4- چۆنیەتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز:

خوێندنی ڕۆژانەی قورئان ئەگەرچی تەنها لاپەڕەیەکیش بێت، گەرخۆت مولزەم بکەیت بەوەی کە ڕۆژانە ئەبێ هەر لاپەڕەیەک بخوێنیتەوە زۆر چاکە چونکە ئەمە وائەکات سوور بیت لەسەر خوێندنی و دانەبڕان لێی، دابڕانی درێژ ساردی دروست ئەکات لەخوێندنەوە.

هەروەها بە دەنگێکی خۆش و هێواش لەگەڵ ڕەچاوکردنی حوکمەکانی تەجوید، عبدالله بن عمرو بن العاص رضي الله عنه ئەڵێ: بەردەوام ابن مسعود-م خۆشئەوێ دوای ئەوەی لە رسول الله صلى الله عليه وسلم بیستم فەرمووی: قورئان لەچوارکەس وەرگرن: ابن أم عبد (واتا: عبدالله بن مسعود) و معاذ بن جبل و أبي بن كعب و سالم مولى أبي حذيفة. [صحيح مسلم : 6488] ، هەروەها أبو بكر و عمر رضي الله عنهما موژدەیان بە (ابن مسعود) داوە کە پێغەمبەرصلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: کێ حەزئەکات قورئان وەکو خۆی بخوێنێ هەروەک چۆن دابەزیوە ئەوا با وەکو خوێندنەوەی ابن أم عبد (واتا: ابن مسعود) بیخوێنێ. [مسند أحمد : 35].

هەروەها دووبارەکردنەوەی ئایەتەکان و وەستان لەسەریان و بیرکردنەوە لە ئایەتەکە، ئایا ئەمرە یان نەهیە تا جێبەجێی بکەم لەخۆمدا، یان بەسەرهاتێکە تا پەندی لێوەرگرم، یان حوکمی شتێکە تا بیزانم، یان موژدەدانە تا هیوام زیادبێ یان هەڕەشەیە تا ترسم زیادبێ...هتد، مەڵێ ئەم وەستانە و بیرکردنەوەیە وائەکات خوێندنەوەکەم دواکەوێ و سارد ببمەوە، وەکو ابن القيم ئەڵێ: خوێندنی ئایەتێک بە تەدەبور و تێگەیشتنەوە باشترە لە خوێندنی خەتمێک بەبێ تەدەبور و تێگەیشتن.

هەروەک ابن عبدالهادي قوتابی شيخ الإسلام ابن تيمية لەمامۆستاکەی ئەگێڕێتەوە ئەڵێ: جاری وا نزیکەی سەد تەفسیرم بۆ یەک ئایەت بەرچاو ئەکەوت، ئینجا داوای تێگەیشتنم لە الله تعالى ئەکرد و ئەم ووت: ئەی فێرکەری ئادەم و ئیبراهیم فێرم بکە، پاشان ئەچومە مزگەوتە چۆڵەکان و دەم و چاو لەناو خۆڵ ئەتەنی و ئەم ووت: ئەی فێرکەری ئیبراهیم تێمگەیەنە. [العقود الدرية : لاپەڕە 43].

## 5- پلەبەندی لە تەدەبوڕدا:

هەموو علمێک سەرەتا لە کەمێکەوە دەست پێئەکرێ ئینجا بۆ زیاترو زیاتر تەدەبوریش بەهەمان شێوە، کەسی تازە دەستپێکردبوو سەرەتا بە ئایەتێک دەست پێئەکات ئەبێ مانای ئایەتەکە بزانێ بەهۆی تەفسیرێکی ئاسان، ئینجا بیر بکاتەوە ئایەتەکە دەربارەی چیە ؟ ئەو لەکوێی ئەم ئایەتەدایە ؟ جا بیربکاتەوە لە ئایەتەکە

بەگوێرەی ئەم مەرجانەی کە لە پۆستەکانی پێشوو باسمان کرد، ئینجا دواتر چەند ئایەتێک دواتر سورەتە کورتەکان دواتر سورەتەکانی تر تا وای لێدێت هەموو قورئان بە تەدەبور ئەخوێنێتەوە، وە خۆڕاهێنان لەسەر تەدەبورکردن شتێکی زۆر گرنگە بەگوێرەی کرانەوەت بەڕووی بابەتەکەدا الله تعالی دەرگای تێگەیشتن و تەدەبورکردنت فراوانتر ئەکات، جا ئەو مانایانەی کە کەسی (متدبر) تەدەبورکەر پێی ئەگات گەر نیشانی کەسێکی شارەزای بدات تا هەڵیسەنگێنێ یان هەڵەکانی بۆ ڕاست بکاتەوە ئاوا بەسوودە تاوەکو ببێتە هۆکارێک بۆ فێربوونی تەدەبور لەسەر ئەساس و أصولێکی دروست و معتبر.

وەهەروەها نوسینی ئەم مانا جوانانەی کە لەهەر کاتێکدا بەمێشکت دادێت، مەڵێ نایەنوسم لەبیرم ئەمێنێ، مرۆڤ رۆژانە بەکاتی جیاواز تێئەپەڕێ ئەو کاتانەی دڵ و سینەت کراوەتەوە بۆ قورئان خوێندن یان گوێگرتن، توانای تەدەبورکردنت زیاترە جا هەر شتێکت لە مێشکتدا دروست بوو بینوسە، چونکە هیچ کەس ئەمین نیە لە لەبیرچوونەوە، ئیمامی بوخاری (رحمه الله) لە خەو هەڵئەستایەوە چراکەی دائەگیرساند سوودێکی ئەنوسی کە بە مێشکی دائەهات، ئینجا چراکەی ئەکوژاندەوە و ئەخەوتەوە، دووبارە هەڵئەستایەوە چراکەی دائەگیرساند بۆ نوسینی سوودێکی تر کە بە مێشکی دائەهات، شەوی واهەبووە بیست جار زیاتر هەڵساوە لە خەو بۆ ئەم مەبەستە.

العلم صيد والكتابة قيـــــده
قيد صيدك بالحبال الواثقــة
فمن الحماقة أن تصيد غزالة
وتتركها بين الخلائق طالقـــــة

عیلم نێچیرە، نوسینی بەستانەوەی نێچیرەکەیە
نێچیرەکەت ببەستەوە بە پەتی توند
جۆرێکە لە گێلی کە ئاسک ڕاو بکەیت
وە لەنێو خەڵکیدا بەرەڵای بکەیت

### 6- دیراسەکردنی قورئان لەگەڵ هاوڕێیاندا:

دانیشتن لەگەڵ هاوڕێیاندا بۆ دیراسەکردنی قورئانی پیرۆز هۆکارێکی یارمەتیدەرە بۆ کردنەوەی ئاسۆ بەڕووتدا لەبواری تەدەبورکردن قورئاندا، هەروەها توانای تەدەبورکردنیش ئەبەخشێ بە کەسەکان و

هەڵەکانیان بۆ ڕاست ئەکرێتەوە، لەوانەیە ئەو مانایانەی کە بە مێشکی تۆدا نەهاتووە بەمێشکی هاوڕێکەتدا بێ، ئەم بە مێشک داهاتنەش پەیوەندی بە زیرەکی و مێشک صافی نیە بەڵکو پەیوەندی بە عیلاقەی نێوان تۆ و قورئانی پیرۆزدا هەیە، زۆرجار ئایەتێک ئەخوێنمەوە کە ئەبینم زانایەک بە جۆرێک تەدەبوری تیاداکردووە ئەڵێم باشە خۆ ئەم تەدەبورکردنە ڕوون و ئاشکرایە لە ڕووکەشی ئایەتەکەدا بۆ بەمێشکی من دانەهات بۆ بەمێشکی ئەو داهات ؟ نهێنیەکەی پەیوەندی بەهێزی ئەو کەسەیە لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا و سستی لاوازی پەیوەندی منە لەگەڵ قورئاندا.

جبريل عليه السلام هەموو ڕەمەزانێک مودارەسەی قورئانی ئەکرد بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەوەبوو ساڵی وەفاتکردنی دووجار مودارەسەی پێکرد، جا سەیری ووشەی فەرموودەکە بکەن ابن عباس رضي الله عنه ئەڵێ: (فيدارسه القرآن) [صحيح البخاري: 5]، هەروەها پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هیچ کۆمەڵە کەسانێک لە ماڵێک لە ماڵەکانی الله دا کۆنابنەوە کە قورئان بخوێننەوە و مودارەسەی بکەن لەنێواندا ئیللا سەکینەت و ئارامی بەسەریاندا ئەبارێ و ڕەحمەت دایان ئەپۆشێ و فریشتە دەوریان ئەدەن و الله باسیان ئەکات لای ئەوانەی کە لەلاینە). [صحيح مسلم: 2699].

جا خوشک و برایان مەڵێن لەم سەردەمەدا ناتوانین کۆ ببینەوە لە مزگەوتدا، لە ماڵێک لەشوێنێکی گشتیدا کۆ ببنەوە، ئەم هەموو سەردان و یەکتر بینینەی یەکتر جارێک تەرخانی بکەن بۆ ئەم کارە بزانن بەرهەمەکەی چی ئەبێت، بەڵام ئەبێ لەگەڵ کەسانی شایستە دانیشن نەک کەسێک هیچ لە زمانی عەرەبی نەزانێت و قورئانخوێندنی تەواو نەبێت چاوەڕێی بکەیت مودارەسە و تەدەبوری قورئان بکات .

## ڕێگرییەکانی تەدەبور کردن و چارەسەرکردنی:

هەروەک چۆن هۆکارێک هەیە بۆیارمەتیدانی تەدەبوڕ کردن بەهەمان شێوە چەند هۆکارێک هەیە بۆ ڕێگری کردن لە تەدەبوڕ کردن هەروەها ئەمانەش چارەسەری خۆی هەیە.

### 1- نەخۆشیەکانی دڵ:

ڕیا و حەسودی و ڕق و کینە و لاوازی تەوحید و ئیخلاص، ئەم دەردانە کاریگەری بەهێزیان هەیە لەسەر ڕێگریکردنی دڵ لەوەی لەززەت لە قورئان ببینێت و تەدەبور لە ئایەتەکانی بکات، ئەوەی ئەم قسەیەش ڕاست ئەکاتەوە ئەوەیە کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئامادەکاری بۆکرا بۆ وەرگرتنی قورئانی پیرۆز بەوەی کە بەشی شەیتانیان لە دڵی دەرهێنا، وەکو ڕیوایەت کراوە [صحيح مسلم : 162].

جا پێویستە دڵت ئامادە بکەیت بۆ وەرگرتنی قورئان و تێگەیشتن لێی و تەدەبورکردنی، سەیری حاڵی نوێژکەران بکە لەدوای ئیمامەوە، هەیانە بیرئەکاتەوە لە ئایەتەکان و تەدەبوری تیادا ئەکات، هەیان خشوعی هەیە، هەیان ئەگریەت، هەیانە نە ئەزانێ ئیمام چی خوێندەوە نەخۆشی چی خوێندەوە، جا تۆش ئەم دڵەت ئامادە بکە بەجوانی چونکە هۆکارە بۆتێگەیشتن لە قورئان، گەرنەیکەیتە شوێنێکی گونجاو ئەوا لەبارنابێت بۆوەرگرتنی قورئان، ئامادەکردنیشی بە پاککردنەوەیەتی لە هەموو ئەو پیسیانەی سەرەوە کە باسمان کرد، وە لە تەفسیری ئایەتی (وثیابك فطهر) ووتراوە: دڵت پاک بکەرەوە.

## 2- پشت کردن لە خوێندنەوەی قورئان:

گەر موسڵمان بە دڵەوە لەوە تێگەیشتبێ کە قورئان کەلامی الله یە ئەوا خوێندنی قورئان لەلای بە لەزەتترین شت ئەبوو، چونکە شتێک ئەخوێنێتەوە کە ووتەی دروستکەری خۆیی و تەواوی بوونەوەرە، ووتەی زاتێک ئەخوێنێتەوە کە گەورەیە بەزاتی و ناوەکانی و صیفاتەکانی، بێنە بەرچاوت خۆشەویسترین کەسی ژیانت نامەیەکت بۆبنێرێ چەندە بە تامەزرۆییەوە ئەیخوێنیتەوە، هەرکاتێک دڵت بۆئەم کەسە بچێت وبزانیت پێی ناگەیت دووبارە و دەبارە سەیری نامەکەی ئەکەیتەوە تامەزرۆیی دڵت بۆ ئەو بەخوێندنی نامەکەی ئارام ئەکەیتەوە، لەکاتێکدا نامەکەی جگە لە سڵاو و خۆشەویستی و ڕێزگرتن و چەندباسێکی دونیایی چیتری تیا نیە، ئەی کتێبێک کە ووتەی الله تعالی بێت وباشترین شتەکانی تیابێت بۆت هەم لەڕووی دونیایی وقیامەتەوە چۆن ئەتوانی لێی دابڕێیت ؟

بێگومان ساردی پەیوەندی نێوان تۆوکەلامی الله تعالی ڕێگریەکی گەورەیە لە بەردەمتدا لە تەدەبورکردن و تێگەیشتن لە مانا جوانەکانی قورئاندا، تا زیاتر بەڕووی قورئاندا کراوە بیت الله تعالی تێگەیشتن و تەدەبورکردنی تۆفراوانترئەکات بۆقورئانی پیرۆز، بەڕاستی حەیفە بەردەوام بین لەخوێندنی کتێبی زانایان و ڕۆژانە بیانخوێنینەوە کەچی کتێبی الله تعالی کەمترین کاتی بۆتەرخان بکەین یان بەتەواوی وازی لێ بهێنین تەنها لە ڕەمەزاندا بیخوێنینەوە، بڕوانە حاڵی سەلەف چۆن ژیاون لەکاتێکدا هیچ کتێبێک بوونی نەبووە لە دەستیان جگە لە قورئان، هەرچی کتێبیشە نوسراوە بۆ خزمەتی ئەم قورئانە نوسراوە یان بۆ خزمەتی سوننەت کە ئەویش هەروەحی الله تعالی یە، جا چۆن وازلە ئەصلەکە بهێنین و بە بیانووی خۆخەریککردن

به کتێبی تر؟ ئەمەش مانای وازهێنان نیە لە کتێبی زانایان بەڵکو هەرزاتێک وگرنگی خۆی پێبدە بەپێی قەدرو گەورەیی زاتەکە، ئەکرێ گرنگی زیاتر بەکتێبی مەخلوق بدەین وکەمترین گرنگی بە کتێبی خالق بدەین ؟
ئەی مرۆڤ، ئەی موسڵمان چ شتێک وای لێکردیت بێ پێویست بیت لە خوێندنەوەی کتێبی خالقەکەت ؟

لەکۆتاییدا ئەڵێم ئەوفەرموودانە بخوێننەوە کە هاتوون لەسەر پاداشتی خوێندنەوەی قورئان بۆنمونە خوێندنەوەی هەرپیتێک بە 10 چاکە ئەنوسرێ، تاکو ئەم پاداشتانە ببن بەهۆکارێک ڕووبکەینە خوێندنی کتێبی الله تعالی، بە نیەتی تەدەبورکردن لە ماناکانیدا وجێبەجێ کردنی لەخۆماندا.

## 3- گرنگیدان بەخوێندن ولەبەرکردنی قورئان و وازهێنان لە تەدەبوڕ کردن:

زۆربەی ئەو مزگەوت وسەنتەرانەی دەورە ئەکەنەوە بۆفێربوونی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزیان لەبەرکردنی تەنها گرنگی بەلایەنی خوێندن و لەبەرکردن ئەدەن و لایەنی تەدەبوڕ پشتگوێ ئەخەن، تەنانەت زۆرێک لەوانەی کە خۆیان قورئانیان لەبەرکردووە بەبێ چوون بۆمزگەوت وسەنتەرەکان تەنها گرنگی بە موراجەعە کردنەوەی لەبەرکردنەکەی ئەدات یان زۆر گرنگی بە تەجوید و وردەکارییەکانی ئەدەن و هیچ بیریان بۆ تەدەبوڕکردنی ئایەتەکان ناچێ، لەکاتێکدا ئامانج لەخوێندنی قورئانی پیرۆزدا تێگەیشتن وتەدەبوڕە ئینجا دواتر کارپێکردنی، کەسی واهەیە هەموو قورئانی لەبەرە بەڵام مانای ئەووشانەی سورەتە کورتەکان نازانێ کە ڕۆژانە ئەیڵێتەوە لەنوێژەکانیدا.

بەڵام بۆمناڵان لەسەرەتادا گرنگیدان بە لەبەرکردن لەپێشترە نەک تەدەبوڕ چونکە مناڵ لەم تەمەنەدا توانای زۆرە بۆلەبەرکردن، وە هەروەها دڵ شوێنی تەدەبوڕکردنە دڵیش بە تێپەڕبوونی تەمەن گەشە ئەکات وتێگەیشتنی فراوانتر ئەبێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستایان ودایک وباوکان ئەتوانن تەدەبورێکی سادە بۆئایەتەکان فێری مناڵەکان بکەن کە لەگەڵ تەمەنیان بگونجێ ئینجا دواتر بەپێی گەورەبوونی تەمەنیان بازنەی تەدەبور فراوانتر بکەن.

چارەسەرکردنی ئەمەش بە باسکردنی ئایەتە وفەرموودە هاندەرەکانە لەسەرتەدەبوڕکردن، هەروەها باسکردنی ووتەی سەلەف دەربارەی سەرزەنشت کردنی ئەو کەسەی کە تەنها قورئان ئەخوێنێتەوە یان لەبەری ئەکات بەبێ تەدەبور هەروەک لە پۆستەکانی پێشوودا ئاماژەمان پێیدا، وە هەندێک لە زانایان ئایەتی (أفلا يتدبرون القرءان ولوكان من عند غيرالله لوجدوا فيه اختلافا كثيرا) (أفلا يتدبرو القرآن أم على قلوب أقفالها) ئەکەن بە بەڵگە لەسەر واجب بوونی تەدەبور وەکوالشوكاني لە تەفسیری فتح القدير باسیکردووە.

## 4- گومان دروست کردن لەسەر ترسناکی تەدەبورڕ کردن:

گومان دروست ئەکرێ گوایە زۆر وورد مەبنەوە لە ماناکانی قورئان چونکە ترسناکە و توشی گومڕایی ئەبن، الوزير ابن هبيرة الحنبلي ئەڵێ: یەکێک لە فێڵەکانی شەیتان ئەوەیە بەندەکان دوور ئەخاتەوە لە تەدەبورکردنی قورئان چونکە ئەزانێ تەدەبورکردنی قورئان هۆکارە بۆ هیدایەت وەرگرتن، جا وای لێ ئەکات بڵێ: من ئەترسم ناوێرم قسە بکەم دەربارەی قورئان.

یان هەیە ئەڵێ هەرکەسێک ڕۆبچێ توشی کوفر ئەبێ، ئەمە ئەوکاتە ڕاستە گەروەکو باطنیەکان بەجۆرێک ماناکانی لێک بدەیتەوە دوورو نزیک پەیوەندی بە ماناکەی نەبێ بەڵکو بۆ نیازی گڵاوی خۆت ماناکان بگۆڕیت و بیگونجێنێ لەگەڵ بیروباوەڕە بۆگەنەکەت، ئەگینا وەرگرتنی مانای ئایەتەکان و لێکدانەوەی لەچوارچێوەی زمانی عەرەبی و تەفسیری دروستدا کارێکی چاک و زۆر بەسوودە.

ابن تيمية ئەڵێ: هەرکەسێک تەدەبورڕ لە قورئان بکات بەنیەتی هیدایەت وەرگرتن ڕێگای حەقی بۆ ڕۆشن ئەبێتەوە.

جا ئایا کاتێک الله تعالى خۆی داوایکردووە تەدەبور بکەین لە قورئان و سەرزەنشتی ئەوانەی کردووە کە تەدەبور ناکەن، چۆن تەدەبورڕ ئەبێتە هۆکاری گومڕابوون و کافربوون ؟!

بەڵام وەکو لە پۆستەکانی پێشوو ئاماژەمان پێدا ئەبێ بەپێی ئوصولێکی ڕاست و دروست تەدەبورڕ بکرێ، نەوەک تەدەبور بکرێتە پردێک بۆ جوانکردنی فکرە بۆگەنەکان، وەکو بینیومانە وئەیبینین ئایەتەکانی قورئان بۆ شەرعیەتدان بە کوفر بەکارهێنراوە.

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين